زنجیرەی پەروەردەی ئیسلامی
٢

# هەوڵدان و زەخیرە دانان
# بۆ
# ڕۆژی دوایی

چاپی دووەم

١٤١٨هـ ١٩٩٧م

زنجیرەی پەروەردەی ئیسلامی

(٢)

# هەوڵدان و زەخیرە دانان
# بۆ
# ڕۆژی دوایی

چاپی دووەم

١٤١٨هـ

١٩٩٧م

## بسم الله الرحمن الرحيم

## ئەم باسە

- روونی دەکاتەوە کە ئەو تاقیکردنەوەیەی مرۆڤ تیایدایە لە ژیانی دونیادا پێویستی بە هەوڵ و رەنج و کۆشش و زەخیرە دانان هەیە بۆ ژیانە بێ کۆتاییەکەی رۆژی قیامەت .

- روونی دەکاتەوە کەس ئاوا بەخۆڕایی و بێ کارکردن لە ئاگری دۆزەخ رزگاری نابێ

- هەڵوێستە جۆراوجۆرەکانی مرۆڤ پێشان دەدات بەرامبەر ئەم تاقیکردنەوەیە و یەکە بەیەکە شی یان دەکاتەوە

# پێشەکی

ئەوەی لە مەکتەبی خوێندبێت باش دەزانی هەموو جارێ کە مامۆستا دێ رۆژێ بۆ تەلەبەکانی دیار دەکات و دەڵێ لەم رۆژەدا تاقیکردنەوەمان هەیە ، قوتابییەکان بەگوێرەی هەڵوێستیان بەرامبەر ئەم تاقیکردنەوەیە و خۆمادە کردن بۆی دەبنە دوو کۆمەڵی سەرەکی : کۆمەڵێکیان هەر لەو کاتەی مامۆستا ئەو هەواڵەیان دەداتێ خەمێ دەیانگرێ و ئیتر هەر لەم رۆژەوە کە دەچنە ماڵەوەو رۆژێ بەڕۆژێ خوێندنی خۆیان دەکەن و هەوڵی خۆیان دەدەن و بەرەبەرە خۆیان ئامادە دەکەن ، وە لەپێناوی ئەم تاقیکردنەوەیە واز لەیاری و گەڕان و سووڕانەوە خۆ خەریک کردن دەهێنن . بۆیە کەڕۆژی تاقیکردنەوە دادێ بەسەربەرزی دەچنە ژوورێ و بەبێ هیچ منەتێک و سەربەرزی یەکی تەواو وەلامی خۆیان دەدەنەوەو دەردەچن .

بەلام کۆمەڵی دووەمیان کە مامۆستا باسی

تاقیکردنەوەکەیان بۆ دەکا وەک ئەوە وایە بایەک بەبنی گوێیان دابڕاو هیچ نایانبزوێنێ ، وە وەکو کۆمەڵی یەکەم ژیانی خۆیان ناگۆڕن بەوەی بکەونە سەر خوێندن و سەعی کردن ، وە لەو ڕۆژانەی پێش تاقیکردنەوە واز لە سینەماو یاری کردن و چوونە بازاڕو گەڕان و سووڕان ناهێنن لەبەر خاتری تاقی کردنەوە .

جا ئەم کۆمەڵەی دووەم لەگەڵ ئەوەی گشتیان ئەنجام و چارەنووسیان بەساقیت بوون دەکا ، بەڵام دەبێ بزانین بۆهەریەکیان هۆیەکی جیا هەبووە وای لێ کردووە مەسەلەی تاقیکردنەوەکە بەهەند هەڵنەگرێ و بەسادەیی وەری بگرێ و پێ ی هیچ نەبێ :

١ - هەیان دەڵێ : مامۆستایەکەمان دڵی نەرم و پڕ بەزەیی یە ، ساقیتم ناکاو یارمەتیم دەدا ، ئینجا لێ ی پاڵ دەداتەوە بەتەمای ئەوەی بەزەیی مامۆستا فریای بکەوێ .

٢ - هەیانە تاقی کردنەوەکەی ئەوەندە بەگرنگ نایەتە بەرچاو کەلە پێناویدا کات و بیری خۆی لێ سەرف بکاو

خـۆی مـاندوو بکاو واز لە هەندێ یاری کـردن و رابواردن بهێنێ و هەندێ شەوان بۆی نەخەوێ ، وەدەڵێ : شەو نەخەوم و نەچم بۆ سینەماو یاری نەکەم و رانەبوێرم چی یە لە تاقی کـردنەوە دەربچم ؟ ! ئەمــە بەمن ناکــرێ واز لەم شتانە بهێنم !

٣ - هەیە خۆشی یەکانی ژیانی رۆژنەی بە ئەنجامی تاقی کـردنەوەکـە دەگـۆڕێتـەوە و دەڵێ : با من بە ئارەزووی خـۆم بگەڕێم و بەخوێندنەکەوە ماندوو نەبم ، ئینجا ساقیت دەبم یان نا سیرو پیاز .

ئەو بیرەشیان لەگەڵ بیری دووەمی پێشوو جیاوازە ، چونکە ئەوانە بە پێـــچـــەوانەی ئەوانی تر تاقی کـــردنەوەکـــە و ئەنجـامـەکـەی بەگـرنـگ تێـدەگـەن ، بەڵام چی یە ؟ ئەوەیە بەخۆشی و رابواردن نایگۆڕنەوە

٤ - هەیە دەڵێ : من دڵم پاکەو مرۆڤێکی پاکم ، مرۆڤی پاکـیش لە هەمـوو جـێگەیەک بۆی دێ و مـەرج نیـە سـەعی بکاو هەوڵ بدا ، ئینجا بەو تەمایە لێ ی پاڵ دەکەوێ کە لە

ژووری تاقی کردنەوەکە ( بۆی دێ ) !

٥ - هەیانە خزم یان ناسیاوێکی هەیە مامۆستایەکی دەناسی ، بەتەمای ئەوەیە بە هۆی ئەوەوە واسیتەیەک بکاو دەربچێ !

٦ - هەیانە بەتەمای ئەوەیە رەفیقەکانی لە ژووری تاقی کردنەوە یارمەتی ی بدەن و هەندێکی پێ بڵێن و دەربچێ ، جا هەر لەسەر ئەو بیرە لی ی پاڵ دەکەوێ .

٧ - هەیانە هەر بەو تەمایە دەستەو ئەژنۆو بێ هەوڵدان لێ ی دادەنیشێ کە مامۆستا جارێکی تر تاقی یان بکاتەوە ( دەوری دووەم ) ، وە لەو جارەدا هەوڵێ بداو دەربچێ .

٨ - هەندێکیشیان لەبەر یاری کردن و گەڕان و سووڕان تاقی کردنەوەکەیان لە بیر دەچێتەوە ، تا نەچیتە ژووری تاقی کردنەوە بەبیریان نایەتەوە .

٩ - هەیانە نیازی ئەوەی هەیە لەناو تاقی کردنەوەکە فێڵ ( قۆپیە ) ی بکا

١٠ - هەیانە کوڕی پیاوێکی خاوەن دەسەڵات و پاسەوانە

، پشتی بەوە دەبەستێ ئەم دەسەلاتەی باوکی لە ساقیت بوون بپارێزێ .

١١ - هەیانە کوڕی ئاغا یان پیاوێکی گەورەی ناو کۆمەڵە یان کوڕی سەرۆک هۆزێکەو لەو باوەڕەدا نیە وماموستایەکەی بوێرێ تەڵەبەی چەشنی ئەو ساقیت بکا

١٢ - هەیانە کوڕی پیاوێکی دەوڵەمەندەو یاری بە پارە دەکا ، هەروا دەزانێ ئەو پارەو سامانەی باوکی ناجیح بوونی بۆ دەکرێ .

# هەڵوێستی مرۆڤ بەرامبەر تاقیکردنەوەی گەورە

ئەو نموونەیەی باس کرا هەڵوێستی قوتابیان بوو بەرامبەر تاقیکردنەوەکانی قوتابخانە ، بەڵام ئەوەی سەیرو سەمەرەیە ئەوەیە کە هەڵوێستی خەڵکی بەرامبەر تاقی کردنەوەی ژیانی دونیاش هەمان شت دوو جۆر هەڵوێست بێ .

بەشێکی خەڵک هەر لەو کاتەی لە ژیان دەگەن و دەزانن وا لە ناو تاقی کردنەوە داینە ، دەست دەکەن بە هەوڵدان و رەنج کێشان و زەخیرە دانان بۆ رۆژی قیامەت ، بەڵام بەشی زۆریان وەکو تەلەبە تەمبەڵەکانی مەکتەب کە فام دەکەن وا لەناو تاقی کردنەوە داینە ، ئەم تاقی کردنەوە مەزنە هەستیان نایەنێتە جووڵاندن ، دەستئەملەژێر بەراسەری دادەنیشن ، ئینجا کە رۆژی قیامەت هەڵدەستێ و بۆ مەیدانی مەحشەر دەبردرێن هەگبەی زەخیرەیان بەتاڵەو

هیچیان پێ نیە ، لە ئاگری دۆزەخ قورتاریان بکا

جا هۆی هەوڵ نەدان و زەخیرە دانەنانی هەرتاکێ لەم کۆمەڵە بۆ تاقی کردنەوەی ژیانی دونیا وەکو کۆمەڵی تەلەبە تەمبەڵەکان بۆ چەند هۆ وبیرێکی هیچ پووچی جیا جیا دەگەڕێتەوە ، ئەوەتا

١ - هەیانە دەڵێ من هەر چەندی لەم دونیایە رابوێرم و کاری خراپ ئەنجام بدەم و پشت لە کاری چاک بکەم و هەرچەند بێ زەخیرە بچمەوە بەردەم خودا ، خودای گەورە لێم دەبوورێ و دووچاری ئازارم ناکا ، چونکە خودا بەزەیی هەیە لەسەر بەنی ئادەم ، واتە : خودا - رحیم - ە .

٢ - هەیانە تاقی کردنەوەی ژیانی دونیاو ئەنجامەکەی ئەوەندە بەگرنگ نایەتە بەرچاو بەشێوەیەک بۆی دەرپەڕێتە مەیدانی هەوڵ و زەخیرە دانان ، وە شایەنی ئەوە نەبێ کە لە پێناویدا واز لە ئارەزوو بازی و رابواردنە ناشەرعی یەکانی دونیا بهێنێ ، وە دەڵێ من با بەئارەزووی خۆم لە ژیانی دونیا رابوێرم و خۆشی دونیا بنۆشم ئینجا لە رۆژی

دوایی هەرچی دەبێ با ببێ .
٣ - هەیانە خـۆشی و رابواردنەکـانی دونیـا بە ئەنجـامی تاقی کـردنەوەکـە نـاگـۆڕێتـەوە ، دەڵێ : من با لە دونیـا بە ئارەزووی خۆم رابوێرم ، لە قیامەتیش با بچمە دۆزەخ .
جـا بیـری ئەوانە لەگـەڵ بیـری دووەمی سـەرەوە جـیـاوازە ، چونکە ئەوانە بە پێچەوانەی ئەوان دەزانن تاقی کردنەوەکە چەند گرنگە و دەزانن ئەنجامەکەی چی یە ، بەڵام خۆشی ی دونیا وای لێکردووە بەو ئەنجامە نەیگۆڕنەوە
٤ - هەیانە دەڵێ : من هـەرچەنـدە نوێژ ناکـەم و بەڕۆژو و نابم بەڵام پیاوێکی دڵ پاکم و هیچ گوناهم نەکردووەو ستەم لەکـەس نـاکـەم و نانی حـەرامم نەچووە بە سکـا ، ئەوەندەش بەسە بۆ دەرچوونم ، وەخوا بەس ئەوەندەی لەمن دەوێ .
٥ - هەندێکـیـان بەهـۆی پیـاوێکی خـواناس یـا لەخـوا ترس باوکیان بووە ، یاخود خزمێکیان لەو بابەتەوە هەیە ، دایان ناوە ئەمـانە لە رۆژی قیـامـەت فـریایان بکەون و قـورتاریان بکەن .

٦ - هەیە هەوڵ و زەخـیـره دانانی کـەسـانی تری وەک برایەکانی یان خوشکەکانی یان باوکی یان دایکی یان کوڕو کـچـەکـانی بەهی خـۆی تێ دەگـاو وا دەزانێ کـە هەوڵ و زەخیرەی ئەوان ئەویش قورتار دەکا

٧ - هەیانە نازانێ یان لەبیر دەکا کە تاقی کردنەوەی ژیانی دونیا یەکجارە و ئیتر تەواو دەبێ

٨ - بەشێکی زۆریشیان لەبەر رابواردن و خۆشی ی دونیاو کەرەستە هەڵخەڵەتێن و فریودەرەکانی ناوی لەبیر دەکا و کە ژیانی دونیـای تاقی کـردنەوەیەو ئێـسـتـا وا لەژێر تـاقی کردنەوەو چاودێری خوای گەورەیەو فریشتەی تایبەتی وردو درشتی کردەوەکانی تۆمار دەکەن .

٩ - رەنگە هەندێکیش هەبن نیازی فێڵ کردنیان هەبێ لە خوای گـەورە وەک ئەو قـوتابیـانەی نیـازی قـۆپیـەکـردنیـان هەبوو لەسەر مامۆستاکەیان

١٠ - هەیانە لە دونیـا خـاوەن دەسـەڵاتەو پاسـەوانی زۆری هەیە ، دەست لەکـاری چاک دەشـواتەوەو وا دەزانێ و ئەم

دەسەلات و پلەو پایەو پاسەوانانەی هەروەکو ئێستای لە ڕۆژی قیامەتیش بەکەڵکی دێن بەرگری ی لی دەکەن و دەیپارێزن.

١١ - هەیانە لە دونیا پلەو پایەکی کۆمەلایەتی ی بەرزی هەیە و خاوەنی خێڵ و هۆزێکی گەورەیە ، وا دەزانێ لە ڕۆژی قیامەتیش بە هەمان پلەو پایە بەرزی لەبەردەم خوای گەورە رادەوەستێ لە مەیدانی لێ پرسینەوە ، وە ئەم خێڵ و هۆزەی گشتی لە پشتی رادەوەستن وەکو جاری جاران .

١٢ - هەیانە خاوەنی پارەو سامانێکی زۆرە ، وادەزانێ ئەم سامانە لەوێشدا بەکەڵکی دێ و قورتاری دەکا

* * *

## تاقی کردنەوەی ژیانی لەگەڵ هی مەکتەب جیاوازە

جا ئەوەی بۆ ئێمە زانینی پێویستە تاوەکو ئەو تاقمەی خاوەنی ئەم بیرە پووچەلانەن واز لە هەوڵ و کۆشش و زەخیرە

دانان نەهێنن ، ئەوەیە کە تاقی کردنەوەی ژیانی دونیا گەلێ جیاوازە لەگەڵ تاقی کردنەوەکانی مەکتەب ، ئەوەیان خودای گەورە داینـاوە کـە خـۆی مـرۆڤی خـوڵقـاندووە ، وەخـۆی چاودێری ی دەکا و لێ ی دەپرسێتەوە و هەر خۆیشی حوکمی ناجـیح بوون یان سـاقـیت بوونی بۆ دەردەکـا ، بەلام ئەوەی تریان مامۆستایەک سەرپەرشتی ی دەکاو نمرەکانی دادەنێ کە ئەویش مرۆڤە وەکو ئێمە

ئێستـاش با پێکەوەو یەکە بەیەکە بیرە جیا جیاکانی ئەو تاقـمـە شی بکەینەوە کـە وازیان لە هەوڵدان بۆ قـیـامـەت هێناوە :

١ - بەگـوێرەی ئەوانەی دەڵێن خـوای گـەورە بەبەزەیی - رحیم - ە راستە خوا رەحیمە ، بەلام دەبێ ئەوەش بزانی کە خوا توند سزاشە هەروەک خۆی زیاد لەجارێک و دووجار لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی : ﴿إن الله شديد العقاب﴾ [1]

---

(١) بروانە : البقرة(١٩٦،٢١١) ، ال عمران(١١) ، المائدة(٢،٩٨)
الأنفال(٣،٢٥،٤٨،٥٢)،غافر(٣،٢٢)، الحشر(٤،٧)

جا ئەگەر مامۆستایەکەش قوتابی ی تەمبەڵ بە ناهەق ناجیح بکاو بەناهەق لەگەڵ تەلەبە زیرەکەکان کە خۆیان ماندوو کردووە یەک حیسابیان بۆ بکا ، ئەوا خوای گەورەی دادوەر ئەو بەندەیە لە سزادان دوور ناخاتەوە کە بەبێ کارو کردەوەو زەخیرەی چاک دەگەڕێتەوە لای ، وە ئەو جۆرە کەسە وەکو ئەو کەسانە حیساب ناکا کە هەموو ژیانیان کردۆتە خەبات و زەخیرە دانان لە پێناوی ئەودا ، چونکە ئەمە لەگەڵ دادوەری ناگونجێ . خوای گەورەی دادوەر چۆن دوو کەس بەیەک چاو سەیر دەکا یەکێکیان هەموو ژیانی لە زەخیرە دانان و هەوڵدان بۆ رۆژی قیامەت تەرخان کردووە ، ئەوەی تریشیان هەموو ژیانی لە رابواردن و ئیشی خراپ بەسەر بردووە

﴿ وما خلقنا السماء والأرض وما بينهما باطلا ذلك ظن الذين كفروا فويل للذين كفروا من النار * أم نجعل الذين ءامنوا وعملوا الصالحات كالمفسدين في الأرض أم نجعل المتقين كالفجار * ﴾ ص ٢٧- ٢٨

واته : بێگومان ئێمه ئاسمان و زەوی و ئەم شتانەی لە نێوانیاندا هەیە بەخۆڕایی بێ مەبەست نەخولقاندووه ، ئەمە بۆچوونی بێ بڕواکانه ، هاوار وهیلاک بۆ بێ بڕواکان لەو ئاگرەی دۆزەخ ، ئایا ئەو کەسانەی بڕوایان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردووە وەکو کافرانی تێکشێوێنی سەر زەوی حیساب بکەین ! یان ئایا پارێزگارو چاکە کاران وەکو بەدکارو خراپە کاران حیساب بکەین !

﴿ أفنجعل المسلمين كالمجرمين * ما لكم كيف تحكمون * أم لكم كتاب فيه تدرسون * إن لكم فيه لما تخيرون * أم لكم أيمان علينا بالغة إلى يوم القيامة إن لكم لما تحكمون * سلهم أيهم بذلك زعيم * ﴾ القلم (٣٥-٤٠)

واته : ئایا ئێمه موسڵمانان وەکو بەدکاران لێ ئەکەین ! ئەوە چیتانە چۆن بڕیارێک ئەدەن ! یا خۆ نامەیەکی (ئاسمانی ) تان بەدەستەوەیە ئەمەی تیا ئەخوێننەوە وەلەم نامەیە ڕێتان بۆ درابێ چیتان بوێ ئەوە هەڵبژێرن بۆ خۆتان ! یان پەیمانی بەهێزتان لەسەر ئێمە هەیە و تا ڕۆژی دوایی

ڕەوا بێ کە هەرچی ئێوە بتانەوێت بتاندرێتێ ! لێیان بپرسە کامیان دەستەبەرو زامنی ئەم قسەیەن !

٢ - وە ئەوانەی تاقی کردنەوەی ژیانی دونیایان بەگرنگ نایەتە بەرچا و ئەوانە بێ رادە بەهەڵە چووینە ، هێشتا ئەگەر تەلەبە تەمبەڵەکانی تاقی کردنەوەی مەکتەبیان بە کەم بێتە بەرچاو رێ یەکی تێ دەچێ ، چونکە لەوانەیە بەهۆی تاقی کردنەوەی تر پڕی بکەنەوە یان بڵێن ساڵێکی ترمان لە پێش ماوە ، وەلەوانەیە تاقی کردنەوەکە یاخود هەر مەکتەب بەگشتی کارێکی گەورەی نەبێ بەسەر چارەنووسیان ، بەڵام تاقی کردنەوەی ژیانی دونیا یەکاو یەک چارەنووسی رۆژی دوایی مرۆڤی لەسەر وەستاوە ، ئەگەر تیایدا سەرکەوێ نیتر لە ژیانی ئەولای لە ئاگری دۆزەخ قورتاری دەبێ و هەتا هەتایە لە بەهەشت دەژی پاش ئەوەی دەکەویتە ناو ڕەزامەندیی خودای گەورە . خۆ ئەگەر ساقیت بێ ئیتر هەتا هەتایە ژیانی لەناو ئاگری سەخت و بەئێشی دۆزەخ بەسەر دەبا ، جا ئایا گرنگ نیە ؟ ! !

٣ - بەگـوێرەی ئەمـانەش کـە دەزانن ئەنجـامی تاقی کـردنەوەی ژیانی دونیـا زۆر        و بەڵام خۆشی ی ژیانی دونیای لەسەر دانانێن و خۆیانی بۆ ماندوو ناکەن ، ئەوانە لەراستـیدا بۆ یە وادەکـەن چونکە ئەنجـامـەکـەی بەدوور تێ دەگەن و لەسەر ئەو پەندە دەڕۆن کە دەڵێ : چۆلەکـەیەکی ناو دەست باشـتـرە لە دەی سـەر دارەکـە ! لەبەر ئەوە ژیانی دونیایان هەڵبژاردووە کە ئێستا لە ناو دەستە ، بەڵام ئێمە لێـیـان دەپرسین : ئایا ئەو خـۆشی و رابواردنە کـاتی یەی دونیـا باشـتـرە ، یان سـەخـتی و سـووتانی ئەبەدی و ناو ئاگری دۆزەخ ؟ ! !

٤ - وە بە گـوێرەی ئەو تاقـمەی هیچ کـارو کردەوە نـاکەن و زەخیرە دانانێن بەوەی کە دەڵێن : دڵمان پاکە ، ئەوانەش بە سەهوو چووینە ، چونکە ئەگەر بچن سەیری قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ بکەن بۆیان دەردەکـەوێ کـە بەبێ زەخـیـرەو کـارو کـردەوەی چاک ، دەرچوون لەم تاقی کـردنەوەیەو قـورتار بوون لە ئاگری دۆزەخ شتـێکی مەحاڵە

پیاو دەستی بکەوێ ، وە لەهەموو جێگەیەکی قورئان کە خوای گەورە باسی ئیمـانی کردبێ کارو کردەوەی لەگەڵ بەستۆتەوە : ﴿ والعصر * إن الإنسان لفي خسر * إلا الذين آمنوا وعملوا الصالحات وتواصوا بالحق وتواصوا بالصبر * ﴾ العصر ( ١-٣ ) .

واتە : سوێند بەڕۆژگار مرۆڤ لە زەرەرمەندی دایە مەگەر ئەوانە نەبن کە بڕوایان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردووەو یەکتریش لەسەر هەق و ئارامگری هاندەدەن .

ئەدی ئایا ئەوانە چۆن دەیانەوێ بێ کارو کردەوە لەم تاقی کردنەوە مەزنە دەربچن ؟ !

٥ - وە ئەوەی کە باوکێکی یان خزمێکی خواناس و لە خوا ترسی هەیە و دەیەوێ بەهۆی ئەوەوە خوای گەورە لەویش خۆش ببێ و لە ئاگرەکە قورتاری بێ ، ئەوەشیان هەر بەهەڵە چووە . ئەگەر تەلەبەش ئەم جۆرە بیرەی هەبێ هێشتا ڕێ یەکی تێ دەچێ ، چونکە بەڕاستی لە دونیادا زۆرجاران واسیتەو واسیتەکاری دەخوا ! بەڵام لەڕۆژی

قیامەت راسیتەو ڕاسیتەکاری نی یە .لەوێ نەکەس ئاگای لەکەس دەمێنی نەکەس بەکەلکی کەس دێ و نەکەسیش گوناهی کەس بەخۆیەوە هەلدەگرێ :.

﴿ ألا تزر وازرة وزر أخرى * وأن ليس للإنسان إلا ما سعى * وأن سعيه سوف يرى * ثم يجزاه الجزاء الأوفى ﴾ النجم( ٣٨-٤١ )

واتە : کە هیچ کەس باری گوناهی یەکێکی تر هەلناگرێ و مرۆڤ هەرچی بە هەولی خۆی پەیدای نەکات بۆی نابێ . وەبێ گومان پاداشتی کردەوەی خۆی نیشان ئەدرێ ، لەرۆژی دواییشا جەزایەکی تێرو تەواوی دەداتەوە ( واتە : پاداشتی چاکەکاران چەندانە ئەبێتەوە سزای خراپەکارانیش بەقەد خراپەکەیەتی و بۆی زیاد ناکرێ )

﴿ يبصرونهم يود المجرم لو يفتدي من عذاب يومئذ ببنيه * وصاحبته وأخيه * وفصيلته التي تؤيه * ومن في الأرض جميعا ثم ينجيه * كلا إنها لظى * ﴾ المعارج ( ١١-١٥ ).

واتە : بێ بڕواکان کەس و کاری یەکتریان پێ نیشان

ئەدرێتەوە و کەس قسەیێ ناکات لەبەر سەختێی ی ئەم رۆژە . بێ بڕوای موجریم لەم رۆژەدا حەز دەکات کوڕو خێزان و براو هۆزەکـــەی ( کـــە پەنای دەدات ) هەروەها هەمـــوو کەسێکی سەر زەمین بکاتە فدیە تا ئەو خۆی رزگاری ببێ . نەخێر ( قوربانی وەر ناگیرێ ) .بەڕاستی ئاگری دۆزەخ بە بلێسەیە

﴿ فإذا جاءت الصاخة * يوم يفر المرء من أخيه * وأمه وأبيه * وصاحبته وبنيه * لكل إمرئ منهم يومئذ شأن يغنيه * ﴾ عبس ( ٣٣-٣٧ )

واتە : کاتێ شاخەو شریخەی رۆژی دوایی هات ، لەو رۆژەدا مـــرۆڤ لە براو دایک و باوک و کـــوڕەکـــانی خـــۆی رادەکات ، لەو رۆژیدا هەموو یەکێ لەوان لە حالێ ناخۆش و سەختێ خۆی خەریکەو لەحاڵی کەسانی تر دەستە بەرداری دەکات .

﴿ ولا تزر وازرة وزر أخرى وإن تدع مثقلة الى حملها لا يحمل منه شئ ولو كان ذا قربى * ﴾ فاطر ٨

واته : هیچ کەسێ باری گوناهی یەکێکی تر هەڵناگرێ .
وە ئەگەر کەسێک بانگی گوناهبارێک بکات تا گوناهی بۆ هەڵگرێ برێکیش چی یە بۆی هەڵناگری ئەگەر چی خزمیش بێ .
﴿ من إهتدى فإنما يهتدي لنفسه ومن ضل فإنما يضل عليها ولا تزر وازرة وزر أخرى وما كنا معذبين حتى نبعث رسولا * ﴾ الإسراء
واتە : ئەوەی هیدایەتی بوو پاداشتی هیدایەت بوونەکەی هەر بۆ خۆیەتی ، وە ئەوەی گومرا بوو ئەوە سزاکەی هەر لەسەر خۆیەتی . وەکەس باری گوناهی یەکێکی تر هەڵناگرێ وەئێمە سزادەر نین تا پێغەمبەر دەنێرین .
٦ - وە ئەوانەی بەتەمای ئەوەن بەهۆی زەخیرەی براو خوشک و خزمەکانیان قورتار بن ، ئەوانەش بەهەڵە چووینە ، چونکە ئەم تاقی کردنەوەیە وەکو هی مەکتەب نیە تەلەبە زیرەکەکان ئەوانەی خۆیان بۆ ئامادە کردووە لە ژووری تاقی

کردنەوە یارمەتی تەلەبە تەمبەڵەکان بدەن و وەڵامەکەیان پێ بڵێن ، ئەوە ئەگەر لە مەکتەبیش ڕوو بدات لە تاقی کردنەوەی خودای گەورە ڕوو نادات . لەم تاقی کردنەوە مەزنەدا ئەوە زەخیرەی خۆی پێ نەبێ بە زەخیرەی براو خوشک و خزم و برادەرەکانی قورتاری نابێ ﴿ يا أيها الناس اتقو ربكم واخشوا يوما لا يجزي والد عن ولده ولا مولود هو جاز عن والده شيئا إن وعد الله حق فلا تغرنكم الحياة الدنيا ولا يغرنكم بالله الغرور ﴾ لقمان ٣٣

واتە : هۆشیار بن لە پەروەردگارتان بترسێن ، لەوڕۆژەش بترسن کە نەباوک بۆ کوڕو نەکوڕیش بۆ باوک نابنە جەزا وەرگری یەکتری . بەڵێنی خوا راستە ، جا ژیانی دونیا فریبتان نەدا ، وەشەیتانیش فریبتان نەدا .

٧ - ئەوانەش کە نازانن یان لە بیریان کردووە تاقی کردنەوەی ژیانی دونیا یەک جارە ، ئەوانەش با تەماشای ئەو نەوانەی پێشومان بکەن کە هاتنە دونیا تاقی کردنەوەی خۆیان داو ڕۆیشتن بزانن ئایا کەسیان جارێکی تر گەڕایەتەوە

سەر دونیا ؟ هەڵبەت نەخێر ، ئەوەش چونکە تاقی کردنەوەی ژیانی دونیا یەک جارەو وەکو تاقی کردنەوەی مەکتەب نیە دەوری دووەمی هەبێ ، ئەوە یەک جارە کە تەواو دەبێ ئیتر ناگەڕێتەوە .

٨ - بەگوێرەی ئەوانەش کە لەبەر رابواردن و خۆشی ی دونیا لەبیر دەکەن خۆیان بۆ رۆژی قیامەت ئامادە بکەن ، ئەوانە ساقیت دەبن و چارەنووسیان بە ئاگری گەرمی دۆزەخ دەگا . وە خوای گەورە ئێستا لەدەیەها جێگەی قورئانی پیرۆزدا ئێمەی بێدار کردۆتەوە کە خۆشی و رابواردنی ئەو دونیایە رۆژی قیامەتمان لە بیر نەباتەوە ، بەڵام بە داخەوە ئەوانە گوێ نادەنە گوتەکانی خوای گەورە ، بۆیە چۆن ئێستا قیامەت لە بیرە دەکەن ، لە رۆژی قیامەتیش کە دەبردرێن بۆ دۆزەخ ئەوا لە ناو ئاگر لە بیر دەکرێن*:

﴿ ونادى أصحاب النار أصحاب الجنة أن أفيضوا علينا من الماء أو مما رزقكم الله قالوا إن الله حرمهما على الكافرين * الذين إتخذوا دينهم لهوا ولعبا وغرتهم الحياة الدنيا فاليوم

نسـاهم كـمـا نسـوا لقاء يومـهم هذا ومـا كـانوا بـأياتنا يجحدون ﴾ الأعراف

واته : دۆزەخـيـەكـان بانگی بەهەشـتی یەكـان دەكـەن و دەڵێن : هەندێ لەو ئاوەیان یان لەو خـواردنەی - كـە خـوا بەئێوەی بەخشـیوە - بمان دەنێ . پێیـان دەڵێن : خوا ئەوانی لەسەر بێ بڕواكـان حەرام كردووە . ئەو كـافـرانەی كـە دینی خوایان بە گـاڵتـەو یاری گـرتبـوو و ژیانی دونیـا فـریبی پێ خواردبوون ، ( بۆیە ) ئێـمەش ئەمڕۆ لە یادیان ئەكەین هەر وەك چۆن ئەوان دیداری ئەمـڕۆژەیان لە یاد كـرد بوو نكۆڵێ یان لە ئایەتەكانی ئێمە دەكرد .

٩ - بۆ ئەوانەش كە وەكـو تەلەبەكانی مەكتـەب بەتەمای ئەوەن فـێڵ لە خـودای گـەورە بكەن ، دەڵێین : ئەگـەر مامۆستـای مەكتەبیش فێڵی لێ بكرێ خوای گەورە لێ ی ناكرێ ، چونكە :

أ- لە دونیـا هیچ كـارێكت یان قـسـەیەكت نیـە بیكەی و بتوانی لە خوای گەورە بیشاری یەوە :

﴿ وإن عليكم لحافظين * كراما كاتبين * يعلمون ما تفعلون * ﴾ الإنفطار

واتە : بێ گومان چەند ئاگادارێکتان بەسەرەوەیە کەبەڕێزن و نووسەری کردەوەکانتانن ، هەرچی ی بکەن دەیزانن .

﴿ ما يلفظ من قول إلا لديه رقيب عتيد * ﴾ ق ١٨

واتە : هەر ووتەیەک بدرکێنێ چاودێرێکی ئامادە بووی لە لا دایە

ب – لە ڕۆژی قیامەتیش ناتوانی ئەو کارو کردەوانەی کردووتە لەسەر خۆتی لا بدەی و خۆتی لێ بێ بەری بکەی ، چونکە هەر ئەندامەکانی جەستەی خۆت شاهێدیت لەسەر دەدەن :

﴿ حتى إذا ما جاءوها شهد عليهم سمعهم وأبصارهم وجلودهم بما كانوا يعملون * ﴾ فصلت ٢٠

واتە : تا کاتێ لە گۆڕەپنی لێ پرسینەوە رادەوەستێ ئینجا گوێ و چاوو پێستەکانیان گەواهی لەسەر ئەو کردەوانە دەدەن کە کردوویانە .

## کەواتە ئەدی چۆن فێڵ لە خودای گەورە دەکەی؟ !

١٠ - ئەویش کە وا دەزانێ دەسەلات و پاسەوانەکانی وەکو ئێستا لە رۆژی قیامەتیش بەکەلکی دێنەوە ، ئەوەش بەهەڵە چووە ئەگەر راست دەکا با ئەو دەسەلات و پاسەوانانەی لە حەزرەتی عیزرائیل بیپارێزن کاتێ بۆ روح کێشان لێ ی دەچێتە ژووری

بەلام ئەوانە ئەو کاتە باش بۆیان دەردەکەوێ کە دەسەلات و پاسەوان هیچ نین ، ئەو کاتەی خوای گەورە موحاکەمەیان دەکا دەڵێن

﴿ وأما من أوتي كتابه بشماله فيقول يا ليتني لم أوت كتابيه * ولم أدر ما حسابيه * يا ليتها كانت القاضية * ما أغنى عني ماليه * هلك عني سلطانيه * ﴾ الحاقة ( ٢٥-٢٩ )

واتە وە ئەو کەسەی کارنامەکەی درا دەستی چەپی دەڵێ خۆزیا کارنامەکەم هەر پێ نەدرابا ، نەمزانیبا چی یە ( سەرەنجامی ) لێ پرسینەوەم ، خۆزیا مردنەکەی دونیام

یەکجارەکی بوایە و زیندوو نەبومایەوە تا رزگار بومایە ، ( خۆ ) ماڵەکەم هیچ سوودێکی پێ نەدام و دەسەڵاتەکەم لە دەست چوو !

وە لەوانە دەپرسێ ئایا خودای گەورە لە دەسەڵات و پاسەوانی ئێوە دەترسێ ؟ ! ئەگەر مامۆستای مەکتەبیش بترسێ و کوڕی خاوەن دەسەڵات و پاسەوانەکە بە ناهەق ناجیح بکا ئەوا لە لای خودای گەورە ئەم شتە نیە ، خواش پاکە لە وێک چوون لەگەڵ دروست کراوەکانی .

١١ - دیسان ئەگەر پلەو پایەی کۆمەڵایەتی لە دونیا فریای تەلەبە بکەوێ و بە ناهەق ناجیحی بکا ، ئەوا لە لای خودای گەورە مرۆڤ بەهۆی خێڵ و هۆزەکەی قورتاری نابێ .

١٢ - بەگوێرەی ئەو کەسانەش کە خاوەنی پارەو سامانن ، ئەوانەش بەهەڵە دەچن ئەگەر وابزانن ئەو پارەو سامانە قورتاریان دەکا . بەگوێرەی تەلەبە بتوانێ بەهۆی پارەو بەرتیل خۆی ناجیح بکا ، بەڵام لە لای خودای گەورە پارە

دەوری نیە :

﴿ للذين استجابوا لربهم الحسنى والذين لم يستجيبوا له لو أن لهم ما في الأرض جميعا ومثله معه لأفتدوا به أولئك لهم سوء الحساب ومأواهم جهنم وبئس المهاد * ﴾ الرعد ١٨

واتە : ئەوانەی بەدەم بانگەوازی خـــــوا چوونە ( فەرمانبەری ی فەرمانی خوایان کردووە ) بەختیاری و چوونە بەهەشتیـــان بۆ هەیە .وە ئەوانەی وەلامی بانگی خـــوایان نەدایەوە ئەگەر هەمـوو ئەو شتـــانەی لەزەوی و چەندەهای تریشیـــان هەبێ گشـتی دەکەنە قـوربانی و دەیبەخشن ( تاکو لە سـزای ئەم رۆژە قـورتار بن .. بەلام لێیان وەرناگیرێ ! ) ئەوانە لێ پرسینەوەیەکی سەختیان بۆ هەیە جێ نشینیـان دۆزەخە کە بەراستی شوێنێکی بەد و ناهەموارە

﴿ و لو أن لكل نفس ظلمت ما في الأرض لأفتدت به وأسرو الندامة لما رأوا العذاب وقضي بينهم بالقسط وهم لا يظلمون * ﴾ يونس ٥٤ .

واته : ئەگەر هەموو ئەو شتانەی لە زەوی دا هەن هی کەسێکی موشریک بێ ، هەمووی دەکاتە قوربانی ( تا رزگاری بێ ) ، وەزۆر پەشیمانی ئەخەنە دڵیانەوە لەو کاتەی سزاو ئازار دەبینن . وە بەدادگەرانە حوکمیان لە نێودا کراوە و زوڵمیان لێ ناکرێت .

﴿ إن الذين كفروا وماتوا وهم كفار فلن يقبل من أحدهم ملء الأرض ذهبا ولو افتدى به أولئك لهم عذاب اليم وما لهم من ناصرين * ﴾ آل عمران ٩١ .

واته : ئەوانەی کوفریان کردو بەکافرێتی مردن ، هەر یەکێکیان ئەگەر بە ئەندازەی زەویش زێڕ بەخشێ و بیکاتە قوربانی بۆ رزگار بوونی ئەوا لێ ی وەرناگیرێت . ئەوانە سزاو ئازارێکی بەئێشیان بۆ هەیە هیچ سەرخەرو پشتیوانیشیان بۆ نیە رزگاریان بکات .

## تاقیکردنەوە هەوڵی دەوێت

**خوشک و برای موسڵمانم**

هەڵبەت هەموو تاقی کردنەوەیە پێویستی بە سەعی کردن و هەوڵدانە بۆ دەرچوون تیایدا ، جا لەبەر ئەوەی ژیانی دونیاش تاقی کردنەوەیە ، کەواتە ئەویش وەکو تاقی کردنەوەکانی تەلەبە لە مەکتەب پێویستی بە خۆ ماندوو کردن و زەخیرە دانان هەیە .

لەبەر ئەوە دەبینین خودای گەورە لە قورئاندا لە زۆر جێگە پێمان رادەگەیەنێ کە خۆمان بۆ ئەو تاقی کردنەوەیە ئامادە بکەین و زەخیرەی بۆ دابنێین و بازووی کارکردنی بۆ لێ هەڵبکەین پێش ئەوەی ماوەکەی تەواو ببێ لەدەستمان بچێ :

﴿ یا أیها الذین آمنوا أتقوا الله ولتنظر نفس ما قدمت لغد وأتقوا الله إن الله خبیر بما تعملون * ولا تکونوا کالذین نسوا الله فأنساهم أنفسهم أولئك هم

الفاسقون * لا يستوي أصحاب النار وأصحاب الجنة أصحاب الجنة هم الفائزون * ﴾ الحشر

واته : هۆ ئەوانەی بڕواتان هێناوە لە خوا بترسن . وەهەر کەسێ با سەرنج بدا داخوا چی ی بۆ بەیانی ( ڕۆژی قیامەت ) پێش خستووە ، ولە خوا بترسن ، بەڕاستی خوا ئاگادارە بەوەی دەیکەن . وە وەک ئەوانە مەبن کە خوایان لە بیر کردووە وە خواش خۆیانی لەبیر خۆیان بردۆتەوە ، هەر ئەوانەن بەدکاران . دانیشتوانی دۆزەخ و دانیشتوانی بەهەشت وەک یەک نین ، هەر دانیشتوانی بەهەشت سەرکەوتوو و ڕزگارن .

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : « الكيس من دان نفسه وعمل لما بعد الموت ، والعاجز من اتبع نفسه هواها وتمنى على الله الأماني » رواه الترمذي وأحمد والحاكم وابن ماجه .

واتە : ژیرو هۆشمەند ئەو کەسەیە کە موحاسەبەی خۆی بکاو بۆ دوای مردن کار بکاو زەخیرە دابنێ ، وەگێل و گەمژە ئەو کەسەیە کە بەدوای ئارەزووی خۆی بکەوێ و تەمای

ئەوە بێ خوا لێ ی خۆش بێ

ئیمامی عەلیش - خودا لێ ی رازی بێ فەرموویەتی ( جیهانی دونیا کاروانی تێک ناو ڕۆیشت ، ئاخیرەتیش وا کاروانی هێنا ، وەهەر یەکێکیان ئەوەی خۆی هەیە جا ئێوە لە ئەوەی ئاخیرەت بن و لە ئەوەی دونیا مەبن وە ئیمڕۆ رۆژی کردەوەیە و رۆژی لێ پرسینەوە نیە ، بەلام بەیانی رۆژی لێ پرسینەوەیە و رۆژی کردەوە نیە» .(٢)

بەلام بەداخەوە هەروەک چۆن هەندێ تەلەبەی تەمبەڵ لە مەکتەب خۆیان بۆ تاقی کردنەوەکانیان ئامادە ناکەن دەبینین خەڵکێکی زۆر هەن دەستەو ئەژنۆ لێ ی دانیشتوونەو هیچ خەمێک لە زەخیرەی رۆژی قیامەتیان ناخۆن ، ئەوانەش هەڵبەتە لە رۆژی قیامەت پەشیمان دەبنەوەو دەستی خۆیان دەگەزن :

---

(١) التاج الجامع للاصول . ج (٥) . (٢١٢) ، شرح سنن إبن ماجه . ج(٢) ل(٥٦٥).

(٢) صحيح البخارى . دارالفكر . بغداد .١٩٨٦.ج(٤)، ل(١١٦)

﴿ كلا إذا دكت الأرض دكاً دكاً * وجاء ربك والملك صفاً صفاً * وجاىء يومئذ بجهنم يومئذ يتذكر الإنسان و أنىٰ له الذكرىٰ * يقول يا ليتني قدمت لحياتي * فيومئذ لا يعذب عذابه أحد * ولا يوثق وثاقه أحد * يا أيتها النفس المطمئنة * إرجعي الى ربك راضيةً مرضيةً * فأدخلي في عبادي * وأدخلي جنتي * ﴾ الفجر ( ٢١-٣٠ ).

واته : نەخێر (بگەڕێنەوە ) ، کاتێ کە زەوی داکوترا کە بە داکوتانێکی توندی یەک لە دوای یەکی ، وەپەروەردگارت و فریشتەکانیش پۆل پۆل هاتن ، وەلەو رۆژەدا دۆزەخ دەهێنرێت ( تا کافرەکان بیبینن ) ، لەو رۆژەدا مرۆڤ یاداوەری ئەکات ( و کردەوە بەدو ناشیرنەکانی بیر ئەکەوێتەوەو دەیەوێت تۆبە بکات ) بەلاّم لە کوێ ئەم یاداوەری یە سوودێک بەو ئەدات ؟ ! دەڵێ خۆزیا لە دونیا کردەوەی چاکەم بۆ ئەمرۆژە بناردایە . لەو رۆژەدا کەس وەکو خوا سزای توندو تیژ نادات ، وەکەس پێوەندی کەس ناکات وەکو پێوەند کردنی خودا ، ( ئەمە سەبارەت بە کافرو دوور

له خوایان ، بەڵام ئیمانداران وانین ) هۆ نەفسەکەس دڵنیا بووی ئیماندار بەرازی بوویی لێ رازیبونتەوە بگەڕێوە لای پەروەردگارت ئینجا بچۆ ریزی بەندە چاکەکارەکانمان و بچۆ بۆ بەهەشتی منەوە

## مافی لەبەرگرتنەوەی پارێزراوە بەهەرشێوەیەک

# ناوەڕۆک

چاوەڕێی زنجیرەی سێ یەم بن

لەگەڵ

**(خێرایی کردن لەزەخیرە دانان )**

ژمارەی سپاردن ( ٢٥٤ ) سالی ١٩٩٧

١٤١٨ ك - ١٩٩٧ ز

چاپخانەي وەزارەتی پەروەردە - هەولیر

